درەوشانەوەی نائومێدی
شیعر ،، حەمەکاکەڕەش ،،
2005
، ،،،،،   ،،،،،،

درەوشانەوەی نائومێدی  پێشکەشە بە دایکم ، نەورۆز ،
جگەر گۆشەکانم ڕەهێڵ ، لاوك ، سایە ،،،،،،،،،،،،
پێشکەشە بە تۆ

مرۆڤ بەسروشتی خۆی شەڕانگێز لە دایك دەبێ ، کەچی
هەموو تەمەنی خۆی لەوە بەسەر دەبا تا بیسەلمێنێ کە شەڕانگێز
نیە!! ڕۆمانی پەڕ ، سەلیم بە

تۆ
چرپەت تامی باران ئەدا
ڕوانینەکانت تیشکی خۆر

پێکەنینت سەمای ئاوە
جێهێشتنت خەمێکی زۆر
*     *     *

لارو لەنجەت شنەی بایە
لێوەکانت گوڵی ماچــــن

ئای من چەن کوشتەی جوانیتم
وەك چۆن مەسیح کوشتەی خاچن

## سەگێك

بایەك لەنیوەی شەودا
یاری بە پەردەی
پەنجەرەی عاشقەکان و
جلی هەڵخراوی سەر تەنافەکان دەکا
سەگێك گوڵێکی پێیەو
فڕێی دەدات بۆ ئاسمان
کێ دەڵێ سەر زەوی
بەگڵاو نازانێ

## یەك ڕەنگی نائومێدی

دوێنێم لە پێری و
ئەمڕۆم لە دوێنێ و
بەیانیم لە ئەمڕۆ دەچێ
بەیەك ڕەنگی
نائومێدی
ڕۆژەکانم
ڕەنگرێژ کراون

2005

## من تەنیام بەفر دەبارێت

من تەنیام تۆ لێرە نیت

باڵندەکان دەفڕن
مناڵەکان یاری دەکەن
ئاوەکان پێدەکەنن
وێنەکان کاڵ دەبنەوە
ئاوێنەکان تۆزی دووریت دایان دەپۆشێ
من تەنیام تۆ لێرە نیت
بەفر دەبارێت
کەسێك نیە
تۆپەڵێ خۆشەویستیم پیا بکێشێ
دەچمە ماڵەوە
تەواو بێئارامم
پەنجەرەکە دەکەمەوە
تەواو بێئارامم
شەقامەکە پڕە لە خەڵك
تۆ نابینم هیچ نابینم
من تەنیام تۆ لێرە نیت
ئاخ لێرە نیت بمبینی
بەم هەموو خەونەوە
بەم هەموو هەراسانیی یەوە
چۆن وێنەکەتم
هێناوەتە ژێر نوێنەکەمەوە
تاشتێك بڵێی
تا چاوێکم لێداگری
دەچمەدەرەوە
وێنەکەت بانگم دەکا
دەگەڕێمەوە هیچ ناڵێ
بەوێنەکەت دەڵێم:
ناشرین شتێ بڵێ
هێندەی زەمەنی لێکردنەوەی
شەمامەیەك لە بێستانیکی
قەراغ ڕێگا
شتێ بڵێ
هێندەی زەمەنی
کردنەوەی ستیانی کۆترێك

هێندەی زەمەنی
قژ داهێنانی گوڵێك
هێندەی زەمەنی
سووراو کردنی پەپوولەیەك
هێندەی زەمەنی
گەیشتنی دوو چۆلەکە بەیەك
من تەنیام
تۆ لێرە نیت
بڵێی چەن جوانە ورشەی ئەستێرە
بڵێی چەن جوانە تریفەی مانگ
چەن جوانە منداڵی باران
تۆ لێرە نیت
من بڵێم : چەن جوانە ورشەی چاوت
چەن جوانە تریفەی لێوت
چەن خەمبارە منداڵی ئێمە
تۆ لێرە نیت
بەم هەموو مەراقەوە
بەم هەموو خەیاڵەوە
بەم هەموو هیچەوە
کوێت بۆ بگەڕێم
یەکە یەکە ئینجانەی
گوڵەکان دەگەڕێم
چڵ چڵ درەختەکان دەگەڕێم
جریوە جریوە
ماڵی چۆلەکەکان دەگەڕێم
نمە نمە بارانەکان دەگەڕێم
دڵی گەرمی ئاگر دەگەڕێم
بەفر لەخەو هەڵدەستێنم و
دەڵێم شوێن پێکانی
لای تۆ بەجێ ناماوە
ئاوێنەی خۆرەتاوی باخچەکان
دەگەڕێم
ژێر چرپای دوو سێوی سەرخۆش
دەگەڕێم

کۆڵانی گوندێکی گریاو
دەگەڕێم
من تەنیام
تۆ لێرە نیت
تەنیایی ورشەی خەیاڵەکانم دەکوژێ
تۆ لێرە نیت
ئەو هەموو گوڵە
ڕوو بە ڕووی با سینگیان ڕووت کردووەو
تۆ لێرە نیت
ئێوارە دێت و
ئەو هەموو ڕەنگە ئەڕێژێ و
تۆ لێرە نیت
شەو دێت و
ئاگری حەزەکان ئەڕژێنە یەکەوەو
تۆ لێرە نیت
دەریاکان دێن و
باڵندەکان دەنووک لەمەمکی شەپۆلەکان
دەدەن و
تۆ لێرە نیت
من تەنیام بەفر دەباریت
کەسێك نیە
تۆپەڵێ خۆشەو یستیم
پیاکێشێ
من تەنیام
تۆلێرە نیت ئاخ تۆ لێرە نیت

٢٠٠٥

عەشق
ژیان

ژن
پیاو

ژیان بێ ژن
یەکسانە بە تەنیایی
ژیان بێ پیاو
یەکسانە بە تەنیایی
ژیان بێ عەشق
یەکسانە بە مردن
2005

## پیاوێك لە خۆم

ئەستەمە بتوانی
وەك چۆن بڕژێیتە تابلۆیەکەوە
ئاوا لە خۆت بڕوانی
ئەم هەموو دژە چییە لە تۆدا کۆبوونەتەوە
ئەم هەموو باڵندەیە چییە ؟
هەر یەکەو بەئاوازیکی دەخوێنن
هەر یەکەو بە ئاراستەیەك ئەفڕن
هەر یەکەو بە ڕەنگێك شت ئەنووسن
ئەم هەموو ڕێگایە چییە؟
هەر ڕێگاو ئەتبەنەوە بۆ شارێکی خەیاڵ
هەر ڕێگاو ئەتبەنەوە بۆ مەنزڵیکی بەتاڵ
ئەم هەموو دەرگایە چییە؟
دەرگایەك بەڕوی گوڵدا ئەکرێتەوە
دەرگایەك بە ڕووی گوماندا
دەرگایەك بەڕووی گریاندا
ئەم هەموو پەنجەرەیە چییە؟
پەنجەرەیەك بۆ باخچە ئەڕوانێ و
پەنجەرەیەك بۆ سەرگەردانی
ئەم هەموو ئاسمانە چییە لە تۆدا
ئاسمانیك سەوزە گیاو
ئاسمانێك سێبەر
ئاسمانێك پەشیمانی

ئەم هەموو دەریا چییە؟
دەریایەك تریفەو
دەریایەك سادەیی و
دەریایەك شپرزە بوون
ئەم هەموو باخچەیە چییە؟
باخچەیەك هەڵوەرین و
باخچەیەك ئاگر
ئەم هەموو كۆڵانە چییە؟
كۆڵانێك نیگەرانی
كۆڵانێك مناڵ
كۆڵانیك تەنیایی
كۆڵانێك كۆتر
كۆڵانێك ناڵەناڵ
ئەم هەموو عەشقە
چییە لە تۆدا؟
عەشقێك بۆ ژن
عەشقێك بۆ مەستی
عەشقێك بۆ ژیان
عەشقێك بۆ پەستی
ئەم هەموو شەڕە چییە؟
شەڕی قەدەرو
شەڕی نەگبەتی و
شەری بەرەڵایی
ئەم هەموو حەزە چییە؟
حەزێك بۆ فڕین
حەزیك بۆ مردن
حەزیك بۆ ڕژان
حەزێك بۆ گریان
ئەم هەموو ئاوێنەیە چییە؟
لە ئاوێنەیەكدا باران دەبارێ و
لە ئاوێنەیەكدا ئاگر دەكەوێتەوەو
لە ئاوێنەیەكدا بیابان دەبینی و
لە ئاوێنەیەكدا جوان دەبیتەوە
ئەم هەموو ئەستێرەیە چییە؟

ئەستێرەی منالّی و
ئەستێرەی یادگاری و
ئەستێرەی نا ئومێدی و
ئەستێرەی کالّ فامی
ئەم هەموو خەیالّە
خەیالّی تەڕ بوون بە بەرد
خەیالّی سووتان بە ئاو
خەیالّی شکان بە ژن
ئەم هەموو سەفەرە
سەفەری باخچە
سەفەری ژیان
سەفەری ئاسمان
ئەم هەموو یادگاریە
یادگاری باران
یادگاری ـ با ـ
یادگاری مندالّی
یادگاری چۆلەکەکان
یادگاری وێنە
یادگاری رێگا
یادگاری کتێب
ئەم هەموو بەفرە
بەفری تووڕەیی
بەفری خەمباری
بەفری چاوەڕوانی
ئەم هەموو پردە چییە لە تۆدا؟
پردی پەپوولەکان
پردی هەناسەکان
پردی دەستەکان
ئەم هەموو دژە چییە؟
لایەکت تاریکی و
لایەکت هەتاو
لایەکت مندالّی
لایەکت پیرییە
لایەکت بەستەلّەک

لایەکت سووتاوە
لایەکت گەمژەیی و
لایەکت ژیری یە
لایەکت پەپوولە
لایەکت جەلادە
لایەکت جوانیەو
لایەکت وێرانە
لایەکت ئاگرو
لایەکت بارانە
لایەکت بەردو
لایەکت ئاوە
لایەکت بەختیاری
لایەکت شکاوە
لایەکت مردن و
لایەکت ژیانە
لایەکت دابڕان
لایەکت ژووانە
لەیەکت راستگۆیی و
لایەکت درۆیە
لایەکت خۆڵەمێش
لایەکت پشکۆیە
لایەکت دەریایەو
لایەکت بیابانە
لایەکت پێکەنین
لایەکت گریانە
لایەکت خامۆشی و
لایەکت زریانە
لایەکت دەڕواو
لایەکت نووستووە
لایەکت دەژی و
لایەکت مردوو وە.

تێپەڕین ئەو ڕۆژانە
ناتوانین جارێکی تر

بگەڕێینەوە بۆ کەنارەکانی خەیاڵ
ناتوانین جارێکی تر
باوەش بەتیشکە سوورەکانی خۆردا بکەین
ناتوانین جارێکی تر
وەکو ـ باـ بەکۆڵانەکانی منداڵیدا
پیاسە بکەین و
فیکە بۆ کۆترکان لێبدەین
ئەزیزم تێپەڕین ئەو ڕۆژانەی
پڕبوون لە جوانی و پێکەنین
تێپەڕین ئەو ڕۆژانەی
من گۆرانیم بۆ دیوارەکانی
تەنیایی ئەچڕی و
ئەوانیش دڵیان دەکردە
ئەلبوومی ئاخ و داخی هەناسەکانم
تێپەڕی ئەو ڕۆژانەی
دەرگاکانی عەشق بەڕوانین دەکرانەوە
نەك بەکلیلەکانی گومان.

٢٠٠٥

ژیان خۆشە
شتەکان سەرگەرمی مەلەن
لە ئاوی ژیاندا
سێوێك لەدارەکەی کەوتۆتەخوارەوە و
چنگی لەتەڵێ گیا گیر کردووە
تا نەکەوێتە ئاوەوە
پووشێك ئەیەوێ
لە لێواری ئاگرێك خۆی دوورخاتەوەو
بەئاوی ژیان تەڕبێ
مێروولەیەك دەستی تیشکێك ڕادەکێشێ
چۆلەکەیەك بۆڵ بۆڵ جریووە
بەگوێسەوانەی ماڵەکەیەوە
شۆڕ بووەتەوە
ڕێوییەك
دڵی بەو پەڕی ژیان خۆشەو
خۆی کردۆتە مردوو.

## ئاگری تەڕ

منالْ بوو هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو
هێشتا باڵندەکان دەنووکیان لەڕووناکی نەدابوو
هێشتا گومان ڕوحی دانەپۆشیبووم
هێشتا تاریکی دەستەکانمی نەدەناسی
هێشتا پێکەنینم بەگریان دەهات
هێشتا بۆن و ڕەنگی گوڵەکان ئاشنام بوون
مردنیش هیچ واتایەکی نەبوو
ئاسمان هێندە دوور نەبوو با هێمنترو
بەرد وا کەلە ڕەق نەبوو
ژیان بەهەموو ڕەنگەکانییەوە
تەڕ تەڕ بوو بەشەونم
ژیان وەك منالێکی لاسار
بە دارتووەکاندا هەڵدەگژا
یەك دنیا تووی بۆ دەتەکاندم
لەسەربانی کۆترەکانەوە
ئەیوت: وەرە هەورەکان بکەرە کۆلارە
وەرە نوکی تیژی ئەستێرەیەك بشکێنە و
ماچی ئاسمان بکە
وەرە بۆ کۆلارە بچراوەکانی خەیاڵ بگەڕێ
لەم دەریا شینەدا
مەلەکە مەلەی گەیشتن بە باڵ
منالْ بووم منالْ
هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو
من دەچوومە کۆڵان
کۆڵان خەوتبوو
کۆڵان بەدەنگی من هەڵدەسا
منالْ بووم
قامیشم لەشینایی و ئاو دادەبڕی
بەخەیاڵی منالی
قامیش دەبوو بە ئەسپ و غاری دەدا
ئاخ پشتی چەند ئەسپە قامیش

لەغاردا دەشكا
مناڵ بووم هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو
دەچوومە كۆڵان
كۆڵان پڕدەبوو لە ژنی وەك باران
لە پیاوی وەك ئاگر
لە حەزی وەك زریان
كۆڵان پڕدە بوو
لەعەرەبانەی پڕمیوەو
لە دەست گێڕی فاڵچی و
لە بەیانی باش و لە مشتەری عاشق
كۆڵان پڕدەبوو لە ڕوانینی پڕ ڕاز
لە هەناسەی پڕ چرپە
ڕۆیشتنی پڕ ناز
كۆڵان پڕدەبوو
لە تیشكە گەرمەكانی هەتاو
لە حەسرەت و خەیاڵ
لە ئاسمان و ئەستێرەو
باڵندە و فڕین و مردن و باڵ
كۆڵان پردەبوو
لە حیكایەتی ڕابردووی بەردەوام
لە خەونی ئاڵۆز
فەرموودەی هیچ و پووچ
كۆڵان پڕ دەبوو لە قسە
كۆڵان پر دەبوو لە دەنگ
یەكێك ئەیووت:
بەئیمانم ئەو ژنە لە دەریاوە هاتووە
ماسییەژنە ماسییە ژن
ئای چەن تەڕە
بەو تەڕییە ئەمسووتینێ
كێ ئاگری تەڕی دیووە
هێشتا بۆنی دەریای لێدێت
چاوەكانی پڕ لە گڕن
مەمكەكانی وەكو پشكۆی ناو دەستی با گەشدەبنەوە
یەكێكی تر نا ئەو ژنە

لە ئاسمانەوە باریوە
چاوەکانی دوو ئەستێرەی
پڕ خەیاڵن
لێوەکانی وەك لێوی مانگ
پڕ تریفەو پڕ لە باڵن گیانی ئەڵێی
پەڵە هەورێکی سپیی یە
قژی شەوی پڕ بارانە
بەسەر کۆڵاندا باریووە
کێ بارانی ڕەشی دیووە
کە منداڵ بووم
گاڵتەم بە حیکایەتەکانی کۆڵان دەهات
نەمدەزانی فڕین و باڵ
ڕوانین و ڕاز چرپەو خەیاڵ
ئەمانە چین؟
نەمئەزانی ئاگری تەڕ
ئاوی سووتاو بارانی ڕەش
هەورە ژن و ماسی یە ژن
ئەمانە چین!
کە قسەیان لە بڕینی عەشق دەکرد
کە بیریان لە باڵ دەکردەوە
بۆ فڕین
بە ئاسمانی عەشقدا
کە گەورە بووم
خەیالّی ژنێك
خەریك بوو بم کوژێ
کە گەورەبووم
عەشق و جوانی ژنێك
وەك تیشکێ ڕژایە هەستمەوە
کە گەورە بووم
ژنێك لە باران تەڕ تر بوو
کە چی لە ئاگر گەرمتر
دەیسووتاندم
کە گەورە بووم
ژنێك لە ئاگر گەرمتر بوو

کەچی لە بەفر دڵڕەقتر
دەیتەزاندم
کە گەورە بووم
لە ژێر بارانی ڕەشی قژی ژندا
سپی سپی دەچوومەوە
کە گەورە بووم
ژن م ناسی
عەشقی ژن بووم
ئاگری تەڕ سووتاندمی
ئاگری تەڕم خۆشدەوێ
ژن ئاگری تەڕی پێیە.

## ئەستێرەیەکی هیچ

ئەگەر ئێستا
لەوێ دەبووم
لەکەناری دەریا
هێمنەکانی ئاسمان
ئاهـ ئێستا لەوێ دەبووم
لە کۆڵانی
ئەستێرەیەکی خەمگین
بە شوێن پەپوولەکاندا
رامدەکرد
لە پشتەوە
چاوی کۆترەکانم دەگرت
وای ئێستا لەوێ ئەبووم
لە باخچەکاندا
لەگەڵ جوانیدا
مەلەم دەکرد
ئای لەوێ دیواری
حەوشەکان
لەبالآی روانینی
مرۆڤەکان بەرزترنین

لەوێ پەنجەرەکانی دڵ
تەنیایی نایانکاتەوە.

## کۆڵانەکانی ژن پڕ پڕن لە غەدری پیاو

بەم هەموو خەون و خەیاڵەوە
بەم هەموو کۆترو ئەستێرەو باڵەوە
ناگەمە ئەوسەری کۆڵانەکانی مردن
ناگەمەن ئەوسەری کۆڵانەکانی ژن
ئەوەی دەینووسم، شوێنپێکانی عەشقە
وەك جێگای ماچێ بەکاڵی
لە کۆڵانەکانی ژن بەجێماوە
کۆڵانەکان ڕەنگاو ڕەنگن
کۆڵانەکانی مردن پڕن لە نائومێدی
کۆڵانەکانی ژن پڕن لە ئاو
کۆڵانەکانی مردن پڕن لە هیچ
کۆڵانەکانی ژن پڕن لە هەتاو
کۆڵانەکانی مردن نە باخچەیان لێیەو
نە جۆلانە و نە حەوزی مەلە و نەیاری منداڵان و نەگۆرانی و
نە پێکەنین و نە چاوشارکێ و نەشەڕە بەفرو نەشەڕە بەردو نە شەڕە ئاو
کۆڵانەکانی مردن بێ دەرگاو پەنجەرەن
ئەوەی دەڕوا ئیتر مەگەر خۆی بزانێ بۆکۆی دەچێ و
ئاخۆ جارێ تر دێتەوە
لە کۆڵانەکانی مردندا
کەس هیچ ناکڕێ ، کەس دوکاندارنییە
کەس ژن ناهێنێ ، کەس منداڵی نابێ
کەس سەیارە ، کەس پاسکیل لێ ناخورێ
کەس وێنەیەك ناگرێ بۆ یادگاری
کەس کۆتر بازی ناکا
کەس باڵندەیەك نابینێ بفڕێ
کەس ژنێك نابینێ لەگەڵ تیشکەکانی کازیوەدا تەندور داخا
کەس ناچێ بۆ جەژن وردەواڵەی ڕەنگاو ڕەنگ بکڕێ
کەس هیچ نانوسێ
کۆڵانەکانی ژن پڕ پڕن لەکۆتر لە باران لە ئاگر لە سۆز لە ئاو

لە ڕوانین لە فڕین لە وەرین لە ئەوین
کۆڵانەکانی ژن پڕ پڕن لە غەدری پیاو.

## پیرییەکی تر

درەختەکان
بەپایز پیردەبن
ئاوێنەکان
بەدرزبردن
یادەکان
بەبیرچوونەوە
پەنجەرەکان
بە داخستن
باخچەکان
دوور لە دەستی ئاو
کاتژمێرەکان بە وەستان
دەریاکان بەلێڵی
کازیوە بەتەم
ئاسمان کە خۆرئاوابێ
باڵندەکان بەوێڵی
شەقامەکان بەچۆڵی
عاشقەکان بە دابڕان
ژن بەتەنیا جێیبێڵی

## هەستێ

واهەستدەکەم کە من تۆم و
تۆیش هەرمنی
کە من ون بم
تۆیش هەروونی
گوڵم هەردوکمان عاشقین
ئیتر جیاوازیمان چییە
کە من پیاوم و تۆ ژنی .

## درەوشانەوەی نائومێدی

لە ئاوێنەکە دەڕوانم
لەم دیوو پەنجەرەی ژوورەکەمەوە
دانیشتووم
خەریکە هەڵدەفڕم
شەڵای خەیاڵم
ئەمەوێ دەستبەرم
بۆ پشکۆی ئاگری ناو تابلۆکە
تا مشتێ پشکۆ ڕۆکەمە دڵی پایزەوە
تاچیتر پایز خەمبارانە
بەکۆڵانەکەماندا تێنەپەڕێ و
هەناسەی بۆنی وەرینی لێنەیات
تەواو مناڵ بوومەتەوە
لەم باخچەوە بۆ ئەو باخچە
بەشوێن پەپوولەیەکدا ڕادەکەم
خەریکە هەڵدەفڕم
شەڵاڵی خەیاڵم
لەپەنجەرەی ژوورەکەمەوە ئەڕوانم
کۆڵان خامۆشە
هەر ژنێك دەبینم
مناڵێك و کۆترێکی پێیە
ئای لەو ژنە لە پایز خەمبارترە
ئەو ژنە بەکۆڵانەکەدا دەڕواو
ژوورەکەی پڕ کردووم لە بۆنی وەرین
بۆنی وەرین لە هەناسەو
هەمووگیانی دێ
ئەو ژنە وەك من خەریکە باڵدەرکا
خەریکە هەڵدەفڕێ
ئای ئەو ژنە لەشەقەی باڵی داو
بەرەو پەنجەرەی ژوورەکەم دێ
خەریکە هەڵدەفڕم
ژنێك لە ژوورەکەمدایە
چ ژنێك

چاوانی وەك دەریا
تەڕ تەڕم دەکەن بەڕوانین
ئەچمە چاوەکانییەوە
تادەخنکێم مەلە دەکەم
مەلەی ئەوین
لە کەناری دەریای چاوەکانیدا
رادەکشێم
دەڵێم ! دەتۆش وەرە تاوێ
لەگەڵما مەلەکە
لەوەتەی هەم
لەگەڵ تەنیایدا مەلەدەکەم
هەرخۆم دەڵێم :ئاخر نابێ
کەس ناتوانێ برژێتە چاوی خۆیەوە
بە کەناری دەریای چاوە کانیدا
لەشەپۆلەکان ئەڕوانم
هیچ هەست بەتەنیایی ناکەم
باخچەیەکم پڕ لەخەیاڵی بارانم
بە کەناری دەریای
چاوەکانیدا پیاسەدەکەم
گوڵ دەبینم
گۆڕی عاشقانی تر دەبینم
پێش من هاتوونەتە چاوەکانیەوە
ئیتر نەگەڕاونەتەوەو
لەچاوەکانیدا مردوون
چەند دێڕێکم خویندەوە
کە دووایین یادگاری
ئەو عاشقانە بوون

دێری یەکەم ١
لەئێوارەیەکی پاییزدا
رژامە چاوی ئەم ژنەوە
دەرەوەم بیرچوو
ئیتر نەگەڕامەوە

دێڕی دووەم ٢
ڕژامە چاوی ئەم ژنەوە
ژیان هیچ مانایەکی نەما بۆ گەڕانەوە

دێڕی ٣
باران دەباری ڕژامە چاوی ئەم ژنەوە
ئیدی خۆم بەخشییە
کەنارە تەڕەکانی دەریای چاوەکانی و
نەگەڕامەوە

ئەوانە چەند دێڕێك بوون
لەدووایین یادگاری
ئەوکەسانەی کەوەك من
ڕژابوونە چاوی ئەم ژنەوە
دووای خوێندنەوەی
ئەو دووایین یادگارانە
ترسێك دایگرتم
کەمنیش ببمە یادگارێکی
کەنار دەریای چاوەکانی و
کەسێکی تر بمخوێنێتەوە
بیردەکەمەوە
ئەبی کەسێکی تر
لە دەرەوەی چاوی ئەم ژنە
وەك من بیرلە هەناسەی
پایز بکاتەوە
ئەبێ کەسێکی تر
وەك من بڕوانێتە
خامۆشکی کۆڵان
بیر دەکەمەوە
لەچاوی ئەم ژنە بچمە دەرێ
بگەڕێمەوە بۆلای ژوورەکەم
بەڵام بەگومانم پەشیمانم
کە چاوی ئەم ژنە جێبێڵم
بۆ کوێ بگەڕێمەوە

لەدەرەوەی چاوی ئەم ژنە
دەریایەك نابینم
کەنارەکانی بۆ عاشقەکان بێ
لەدەرەوەی چاوی ئەم ژنە
ئاسمانیك نابینم
بۆ باڵندەکانی خەیاڵ
گەڕانەوە بۆ کوێ
لە دەرەوەی چاوی ئەم ژنە
ئەبێ هەر بەخەیاڵ
بیرلە چاوی ئەم ژنە بکەمەوە
ئەبێ هەر بە خەیاڵ
بیر لە ئێوارانی کۆترەکان بکەمەوە
کە دەڕژانە دەمی یەکترەوە
بۆ کوێ بگەڕێمەوە
بگەڕێمەوە بۆ ژووره چۆڵەکەم
بۆ ئامێزی تەنیایی
بۆ لای ئاوینەکەم
بۆلای پەنجەرە خەمبارەکەم
بگەڕێمەوە
بۆ شەقامە ساردەکانی نیشتمان
کە لە ڕوخساری عاشقەکان غەمبار ترن
بگەڕێمەوە
بۆ باخچەکانی شار
کە ژووانی هەموو شتێکن
عاشقەکان نەبێ
بگەڕێمەوە
لەشەڕەکانی نیشتیماندا
بکوژرێم
کە نیشتیمان نیشتیمانی
هەموو کەسێکە عاشقەکان نەبێ
نانانا ـ ناگەڕێمەوە
کەنارەکانی دەریای چاوی
ئەم ژنە چۆڵ ناکەم
بێ دەریای چاوی ئەم ژنە هەڵناکەم

لێرە بمرم بەختەوەرم
کەنارێکم هەیە بۆ مردن
لەدەرەوەی چاوی ئەم ژنە
ژیانم شتێکە لە خەمباری
ژیانم ئاسۆگەیەکی نیە
بۆ رووانین
ژیانم بیابانێکی تەنیایە
لەدەرەوەی چاوی ئەم ژنە
ژیانم نائومێدییەکی هیچە
گەڕانەوە بۆ کوێ
کێ دەڵێ تا دەگەڕێمەوە
مەرگ هاوڕیکانم نابا
چەندین شەڕی نوێ هەڵناگیرسێن
چەندین باخچە ناکرێنە سەنگەر
کێ دەڵێ : تا لە چاوی ئەم ژنە دێمەدەرەوە
پیر نابم
کە پیر بوومم ئیدی هیچ ژنێك
ناهێڵێ بڕژێمە چاوەکانییەوە
ئێستا من لەچاوی ئەم ژنە دام
ئەوتەنیایەو
منیش تەنیام
ئەبێ لە چاوی ئەم ژنە بێمەدەرەوە
تەنیاییەکانی پڕکەم لەدەنگ
بێڕەنگییەکانی پڕ کەم لە ڕەنگ
شێواوێکانی قژی داهێنم
چاوی مەمکەکانی ئازادکەم
ئەچمە دەرەوە
لەئامێزی دەگرم ماچی دەکەم
لەژوورەکەمدا باران دەبارێ
ژوورەکەم پڕ دەبێ
لە پەپوولەو گوڵاو
هەناسەمان وەك ـ با ـ هەڵدەکا
ژوورەکەم پڕ دەبێ لە ئاو
من و ئەو ژنە

لەدووماسی دەچین
ژوورەکەم
وەك دەریا دێتە بەرچاو
خەریکە هەڵدەفڕم
شەلاڵی خەیاڵم
لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە
لە کۆڵان دەڕوانم
کۆڵان خامۆشە
ژنێك و منداڵێك ئەبینم
دەستێ لەپەنجەرەی
ژوورەکەم دەدا
دەستێ لەباڵی کۆترێکی
بریندار دەچێ
پەنجەرەکە دەکەمەوە
ژنێك لە پایز خەمبار تر
لە جوانی ناسکتر
پێم دەڵێ : کۆترێك هاتە ژوورەکەتەوە
کۆتری مناڵەکەی منە
شەلاڵی خەیاڵم
دەڵێم فەرموو
دەڵێ سوپاس
دەڵێم : سوپاس بۆ دەریای
چاوەکانت کە نەخنکام
سوپاس بۆ تۆ
کە بە خەیاڵ
نا ئومێدیەکانم درەوشایەوە

## وێنەکانی ژیان

ژیان یەك وێنەی نیە
ژیان یەك ڕەنگی نیە
ژیان یەك دەنگی نیە
ژیان لە کۆلانێکی تەنگەبەردا

پڕە لە خەیاڵی گۆڕەپان
ژیان لە قوتابخانەیەکدا
پڕە لەخەیاڵی گەورە بوون و
دەرچوون و
دەرچوون بۆ دوارۆژ
ژیان لەزینداندا
پڕە لە بیر کردنەوە
لەئازادی
ژیان لەنەخۆشخانەیەکدا
بۆنی حەب و دەرزی لێدێت
ژیان لە کەشتیدا
پڕە لە خەیاڵی بیابان
ژیان لە گوندێکدا
پڕە لەبیرکردنی شەقامەکانی
شار
ژیان لەفڕۆکەیەکدا
تاسەکردنی سەر زەوییە
ژیان لەقیتارێکدا
هەستکردنە
بەخێرایی کات
ژیان لەمزگەوتێکدا
پڕ ئەبێ لە بۆنی
بەهەشت و دۆزەخ
ژیان لە ئاهەنگێکدا
پڕ ئەبێ لە جوانی و حەسرەت
ژیان لە سیاسەتدا
پڕ ئەبێ لە گومان
ژیان لە تەنیای
پڕ ئەبێ لە بێ تاقەتی
ژیان لە کڵێسایەکدا
بۆنی خواوەندی لێدێ
ژیان لە گۆڕستان دا
شەلاڵی نائومێدی دەبێ
ژیان لەباخچەدا

وەك باران تەڕئەبێ پەنجەكانی
ژیان لە گەڵ تۆدا
پڕئەبێ لە عەشق لە جوانی

## پیاوێك ئەستێرەی ئەدواند

پیاوێك بەتیشكەكانی خۆر
وێنەی یارەكەی دەكێشا
باسی ناسكی بۆ ـ باـ دەگێڕایەوە
ئەیوت : ئەی ئاو
یارەكەم لەتۆ نەرموشلترە
ئەیوت : ئەی ئاگر
یارەكەم لە تۆ عاشق و
گەرمترە
بەبەفری ئەوت
ڕەنگی یارەكەم لەدڵی تۆ سپی ترە
بەباخچەی ئەوت
بۆنی یارەكەم لەبۆنی تۆ خۆشترە
ئەوپیاوە
عەشق باڵندەی ئاسمانی سەری بوو
عەشق هەر عەشق
كراسی بارانی بەری بوو
ئەو پیاوە یارەكەی
هەرچی ئاوێنەی وەفا بوو شكانی
ڕێگای ژوانی لەدڵی شاردەوە
ئەو پیاوەی
بۆ ماڵی تەنیایی ناردەوە
ئەو پیاوە
ئەستێرەی ون بووە
وێنەی تاریكی ئەكێشێ
نازانێ ئاو نەرموشلترە یاخود بەرد
نازانێ دڵی بەفر سپی ترە
یاخود دڵی تەنیایی
نازانێ باخچەكان بۆن خۆشترن
یاخود مەرگ

٢٠٠٥

دەنگت ئەچێتەوە
سەر پێکەنینی ئاو

گوڵم باسێکی ترم دەوێ
وا مەستم کات
هەست بەسپێتی بەفرنەکەم
هەست نەکەم
رۆژێ دەبێ بمرم
هەست بە دڵتەڕی ئاگرنەکەم
هەست نەکەم
باران و فرمێسکەکانی تۆ
لەیەك دەچن
گوڵم باسێکی ترم دەوێ
بێزار بووم لەپەیامەکان
دێڕێکیان نیە بۆ عەشق
سۆزێکیان نیە بۆ ژیان
خەیاڵێك بۆ جوانی
بۆ بیرکردنەوە
لە تەنیایی
لە نەرموشلی ئاو
لە مناڵی بەفر
لەبێدەنگی بەرد
لە شێتی ئاگر
لە چاو مەستی باران
لەکردنەوەی
دەرگای ژیان و مردن
گوڵم لەم دڵی تەڕی ژیاندا
هیچ شتێك نابینم
هیندەی گریانی منداڵێ
تەنیایی ژنێ پەستم کا
هیچ نابینم

هیچ نابیستم
هەر بەیتەکۆنەکانی رۆژگارە
تۆشتێ بڵێ
چرپەی دەنگت
دەچێتەوە سەر پێکەنینی ئاو
دەچێتەوە سەر خەیاڵەکانی کۆتر
لەکاتی پوش راکێشاندا
دەچێتەوە
سەر نامەیەکی دڵداری
بەر لەوەی
لەدڵەوە بگاتە گوڵ
لەئاوا دەخنکێ و
دێرەکانی تەمەنی کاڵدەبنەوە
گوڵم تۆ شتێ بڵێ
من هەر چیم پێ بوو
وتم بۆهیچ و پووچی ژیان و شەڕەکان
بۆ جوانی کۆترەکان و
بۆ عەشقی ژن و
تێکدانی شتە پیرۆزەکان

٢٠٠٥

## نامەیەك بۆ عیسا چیایی

هاوڕێ بم بەخشە
نەهاتم بۆلات
بم بەخشە نەمتوانی بێم و
قومێ گریانی
مشتێ پیکەنین
رۆکەمە ئینجانەی شیعری سەرتەوە
بم بەخشە نەمتوانی
پەنجەرەیەك لەخەمی دڵت بکەمەوە
هاوڕێ بم بەخشە
ئەورۆژەی سەفەرم کرد
ئەورۆژەی
سەری خۆم دایە دەستی قەدەر

قەدەری غوربەت
قەدەری تەنیایی
قەدەری حەسرەت
بم بەخشە
شپرزە بووم وەکو باران
وەکو ــ باــ
لەرێگا ئاوڕم دایەوە
دڵم بۆ کوچەکانی مناڵی
سەر گەردان بوو
هاوڕێ
بم بەخشە
خۆم دایە دەستی قەدەرێك
ئاشنای کردم بەهەناسەکانی
بەرەڵاترین وڵات
بەرەڵاترین تورکیای دونیا
هاوڕێ بم بەخشە
چەند لاپەڕەیەکی سەفەرت
بۆ دەنووسمەوە
لەتورکیا ـ سالمی شاعیرم
بیرکەوتەوە
کە دەڵێ : تورکان هێندە بێفەڕن
لەشەخسیش ئەدەن زەرەر *
بە خەیاڵی ئەفلاتوونەوە
هاوڕێ بەخەیاڵی سوفیستەکانەوە
بەخەیاڵی زۆر باو ئازادی یا مەرگ
وەك ـ با ــ
بەدارستانەکانی
یۆناندا دەڕۆیشتم
تا لە فەلسەفە بگەم
تا لەگەڵ سوقراتا
پێکێك ژەهر بخۆمەوە
هاوڕێ گەیشتمە ئەسینا
زبڵدانی مێژووم بینی
پرسیاری سوقرات و

ئەفلاتوونم کرد
هیچیان لەوێ نەبوون
ئەسینا بێ فەلسەفە دەژیا
هاورێ بەدڵی ئەو دەریایەدا رۆیشتم
کە هۆمیرۆس
لە ئەلیادەو ئۆدیسەیا باسی دەکا
تا گەیشتمە رۆما
لە رۆما لە کچێکم پرسی
نیرۆن چۆن دڵی هات
رۆما بسوتێنێ؟
وتی : نیرۆن دڵی نەبوو
تۆ پیاوی بێ دڵت نەدیووە؟
وتم : نیشتیمانەکەی من
پڕە لەپیاوی بێ دڵ و
باسی بچوکی دڵی چۆلەکەکان دەکەن
پیاوەکانی نیشتمانەکەم
دڵیان نیەو
ئەڵێن ئەی نیشتمان
تۆ لەدڵماندای
هاورێ رۆما رۆمانێکە
بەپەیکەر نووسراوەتەوە
نەمتوانی ئەو رۆمانە
بخوێنمەوە
نەمتوانی گوێ لە کپی
رۆمابگرم
گەیشتمە ئەڵمانیا
بڕوام نەدەکرد هیتلەر
لەوێ ژیابێ
بەدانیمارکا چووم بۆ سوید
ساڵێ تەمەنم بەخشییە بەفر
هاورێ بم بەخشە
ناتوانم حەسرەتەکانی
چاوەڕوانی کەمپ بنووسمەوە
بم بەخشە

نەمتوانی لە لاتبم
نەمتوانی قومێ گریان
مشتێ پێکەنین
رۆکەمە ئینجانەی
شیعری سەرتەوە

٢٠٠٢

## ئەبێ یاری بەئاگر کەین

تۆچەترەکەت
لەژێر باراندا هەڵدەدەی
تا تەڕ نەبی
خۆ ناتوانی رێ لەبارانی
روانینەکانم بگری
تۆ چۆن گلاسێك ئاو
ئەرژێنیتە ئینجانەی گوڵەکانەوە
ئاوا ئەرژێمە چاوەکانتەوە
تاتینوێتی
گوڵی چاوەکانت بشکێنێ
کە ئەتبینم
تەواو مناڵ دەبمەوە
پیری کاڵمان دەکاتەوە
بۆ رێ لە عەشقی من دەگری
با بەعەشقەوە بسووتێین
مردن ژیانی ناخۆش کردووە
پەنجەرەیەك نیە
مردن نەیشکێنێ
ئاوێك نیە مردن
وشکی نەکاتەوە
دەرگایەك نیە
مردن نەیترازێنێ
رێگایەك نیە
مردن بۆ خۆی نەیباتەوە
کەسێك نیە
مردن نەی دۆزێتەوە

ئاگرێك نیە
مردن نەی کوژێنێتەوە
لەم بیابانی ژیانەدا
عاشق نەبین
چۆن گوڵ لەدڵمانا ئەڕوێ
ئەبێ چیترمان پێبکرێ
عاشق نەبین
بۆ ڕێ لەعەشقی من دەگری
چی روئەدات
ئەگەر بەبۆنی گوڵەکانت
مەستم بکەی
چی روئەدات
ژیان بەماچ بنووسینەوە
بۆ وەك مردن
وەك تەنیایی
پەستم ئەکەی
بۆچی نابێ
ئەگەر یاری بەئاگر کەین
بۆچی نابێ
ئەگەر بڵێن بەردیش نەرمە
باوەك باران
تینوێتی ژیان بشکێنین
لەبەفرەوە ئەبێ وانەیەك
فێربین
چۆن بەکپی ئەچێتەوە
لەچاوی ئاگر بڕوانین
هەتا دەمرێ سەما دەکات
ئەبێ ئێمەیش سەمابکەین
سەمای عەشق
سەمای فڕین
سەمای ڕوانین
سەمای خەیاڵ
سەمای وەرین
سەمای کازیوەی بەیانی

تا ژیان پڕبێ لە جوانی
ئەبێ ژیان ڕەنگڕێژ بکەین
بەڕەنگەکانی عەشق
بەبێ عەشق ون ئەبین
لەدارستانەکانی ژیاندا
بە بێ عەشق تەنیا ئەبین
لە کۆلانەکانی ژیاندا
بە بێ عەشق تەنیا ئەبین
لە پێکەنین و گریاندا
ئەگەر باڵەکانی عەشق نەبێ
ناتوانین
بۆن بەئەستێرەیەکەوە بکەین
ئەگەر چاوەکانی عەشق نەبێ
شوێن پێی پەپوولەیەك
نابینین بەدڵی باخچەوە
عەشق نەبێ
ناڵەی ژنێکی تەنیا نابیستین
بەبێ گۆرانیەکانی عەشق
ئەم کاولەی ژیانە
ئاوەدان نابێتەوە
ئەبێ عاشقی باڵندەیەك بین
لەکاتی فڕیندا
ئەبێ عاشقی گوڵێك بین
لەکاتی وەریندا
ئەبێ عاشقی باران بین
لە کاتی بارینداا
نابێ هەرعاشقی
شتە عادەتیەکان بین
تا پارسەنگی ژیان تێك نەچێ
ئەبێ عاشقی زەڕەی کەرو
بۆڕەی مانگاو
میاواندنی پشیلەو
وڕەی تراکتۆرو
قوقە قوقی  کەڵەشێرو

زیکە زیکی سیسرك و
لورە لوری گورگ و
نەڕە نەڕی شێربین
ئاساییە لەژوورەکانماندا
لەجێی وێنەی سیاسییەك
وێنەی پەتاتەیەك هەڵواسین
ئاساییە ئەلبومەکانمان
پڕبن لە وێنەی بەتاڵ
ئەگەر عاشق بین
هەموو شتەکان هاوڕێمانن
ئەگەر عاشق نەبین
ناتوانین هیچ بین

## مردن کەوانەی شتەکانە

وەك ـ باـ دەڕواو
وەك بەفر ئاوڕ دەداتەوە
ئاوڕ بۆ مناڵی دەداتەوە
گوڵەکانی هەڵدەوەرێن
باڵندەکانی ناخی
بۆ دوواجار
ماڵئاوایی لێدەکەن
باڵندەکانی ناخی
بەباڵ شتێکیان
لەسەر دڵی نووسیوە
وەك یادگاری
شەوێکی باراناوی
تا لە تەنیایدا
هەناسەیەکی ئارامی

بەخەیاڵدابێت و
ئەو یادگارە
بخوێنێتەوە
کە لە وێنەی
ئەستێرەیەك دەچێ
کە هیچ نیە
وەك با دەڕواو
وەك بەفر ئاوڕ دەداتەوە
ئاوڕ بۆ مناڵی دەداتەوە
گوڵەکانی بەدەم هەڵوەرینەوە
هێندەی مەمکی کۆترێ
بۆنی بۆ ڕۆدەکەنە ڕێگای خەونەوە
گوڵەکانی بەدەم هەڵوەرینەوە
دەڵێن تۆیش
لەکاتی وەریندا
ئەو بۆنە داکرمێنە
تا لەکاتی هەراسانی و
خەمگینیدا
بەختەوەری
بڕژێتە ئینجانەی
خەیاڵی دەستەکانتەوە
مردن لە سەوازایی
باخچەکەت دوورکەوێتەوە
مردن گەمارۆت نەدا
مردن ئاوێنەکانت
نەکاتە خۆڵەمێش
بەڵام ئاخ مردن دێ و
چرای ئومێدەکانی
فڕێدەداتە دەریاوە
مردن دێ و بارانی
ڕوانییینەکانی
بەخۆڵ دائەپۆشێ
مردن دێ و
تریفەی پێکەنینەکانی

لە چاڵێکی تاریکا ئەشارێتەوە
مردن دێ و
یادگارییەکانی پێ راناگەن
مردن دێ و زرمەی کەوتنی
هەمووشتەکان دێ
وەك ـ باـ دەڕواو
وەك بەفر ئاوڕ دەداتەوە
دەڕوا دەڕژێ بە سەر مردنا
ئاوڕدەداتەوە
مردن دەڕژێت بە سەریا

٢٠٠٥

## بێ ڕەنگەکانی خۆشەویستی

ئەتوانی سەیری گوڵ و
باڵندەو باران و ئاگر کەی
ئەتوانی سەیری بەفرو
باـو دەریا و دارستان کەی
ئەتوانی لەمێروولەیەك وردبیتەوە
ئەتوانی شۆڕبیتەوە
بۆ تروسکای ناو بیرێك
ئەتوانی بەڕوانینێك
بچیتە ئەودیو هەورەکانەوە
ئەتوانی هەزار ساڵ دانیشی بەدیار
رووتبوونەوەی ژنێکەوە
بەلاتەوە گران نیە
لەشەقامیکی چۆڵا
سەدەیەك چاوەڕێی کەسێك بکەی
کە عەیامێکە مردووە
بەلاتەوە ئاساییە
نامەیەك هێندە بخوێنیتەوە
تا دێڕەکانی بەتیشکی چاوت
ئاگر دەگرن
ئەتوانی بچیتە قوڵای ئاو

دڵیشت پڕبێ لە چراکانی عەشق
ئەکرێ لەگەڵ کۆترێکدا بفڕی و
هەگیز نەنیشیتەوە
تاسەر زەوی
داوای لێبوردن نەکا
ئەتوانی بەکۆمەڵێك تەمەنەوە
مناڵێك بی
بۆنی گڕوگاڵ لەدڵت بێ
ئەکرێ هەرچی سێوی دونیاهەیە
لەزەتی مەمکی ژنێك نەبەخشن
ئەبێ خۆر
هێندەی چاوی ژنێك گەرم نەبێ
ئەبێ ئاو
هیندەی دڵی ژنێك گەرم نەبێ
ئەشێ ئاگر
هێندەی ژنێك سەمانەکا
ئەشێ باران
هێندەی ژنێك
تینوێتی نەشکێنێ
ئەشێ بەفر
هێندەی ژنێك
کپ و سپی نەبێ
ئەکرێ هەموو شتێك لەیاد کەی
چاوەکانی ژنێك نەبێ
ژنێك ئەتوانێ وابکات
هەست بەتەڕی باران نەکەی
ژنێك ئەتوانێ
بەسپێتی خۆی داگیرتکا
هەست بەسپێتی بەفر نەکەی
ژنێك ئەتوانێ بەسۆزی خۆی
داتپۆشێ و
هەست بەسۆزی باخچەنەکەی
ژنێك ئەتوانێ
بەجوانی وێرانتکاو

هەست بەجوانی
کۆترەکان نەکەی
ژنیك ئەتوانێ
فێری فرینتکا بێ باڵ
ژنێك ئەتوانێ بەپێکەنین
خەیاڵتکا خەیاڵ
ئەتوانێ لەدەریایەکدا
بەپێچەوانەی باوە مەلەکەیت
ناتوانی شەپۆلەکانی ژنێك
ئارامکەیتەوە
ئەتوانی گوڵێکی تەنیا
بۆ باخچە بەریتەوە
ناتوانی دڵی گریاوی
ژنێك ژیرکەیتەوە
ئەگەر ئاهەکانی نەبیستی
ناتوانی لێوەکانی سوورکەیتەوە
بێ رەنگەکانی خۆشەویستی

## دەست و دونیا

دەستێکم خەون دەبینێ و
لە خەونیدا
سڵاولە باڵندەکانی ژیاندەکات
سڵاو لەسێبەری یادگارییەکان
سڵاو لەشوێنپێی
چۆلەکەکانی مناڵی
دەستێکم خەیاڵدەکا
خەیاڵی پەشیمانبوونەوەی
ئەو نامانەی
بۆ بەردی نووسیوە
خەیاڵی ئەو رۆژانەی
بۆ ئاوپێکەنیوە
دەستێکم بەکوڵ دەگری
دەڵێ ئێمە عاشقەکانی رۆژگارین
ئێمە هەموو شتێکمان خۆشدەوێ و

دوژمنی خۆمانین
ئاسمانی ئێمە
لەدڵۆپێ باراندایە
باخچەی ئێمە
لەسەر باڵی کۆترێکە
پەنجەرەی روانینی ئێمە
ئێوارانی ئاوابوونی خۆرە
هەڵکردنی شنەبایە
لەوسەری کۆڵانەوە
بەڵام ژیان دوورە
لەباخچەو
پەنجەرە و شنەبای ئێمە
ژیان پڕە لەدەنگدانەوەی
دەنگە هیچەکان
چمکی دونیا بەدەستی
دەستە بەتاڵەکانەوەیە

٢٠٠٥

## سبەی دلێك دەوەرێ

کچێك لەکۆتر دەچێ و
نوقمی روناکی و
جوانی دەبێت
بارانێکیش نەرم نەرم
دەڕژێتە دلی ئەم ئێوارە
خەمبارەوە
ئیمڕۆ گولێك دەوەرێ و
سبەی دلێك دەوەرێ
دوێنێیش دەبێتە دەستێکی
کاڵ بەڕەنگەکانی زەمەنەوە
زەمەنیش وەك شتێك
بەشەقامەکانی ژیاندا رادەکات و
وەرزەکان دێنێ
زستان دێ
گوناهە بەفرنەبارێ و

تۆ بەهەناسەت
گەرمی نەکەیتەوە
بەفر کە دەگاتە دڵی گەرمی تۆ
دەبێ بە ئاو
بەدەم هاژەی خەیاڵەوە
دەڕژێتە دەشتەکانەوە
منیش لەبیابانی تەنیاییەوە
دەگەڕێمەوە
بۆلای جوانییەکانی تۆ
دەگەڕێمەوە
بۆلای فڕینەکانی تۆ
دەستەکانیشم وەك بەفر
دەڕژێنە پێدەشتەکانەوە
بێهودە دەمەوێ
ئێوارەیەکی تەڕ وەك چاوت
بەیانییەکی گەش وەك دڵت
مناڵ مناڵ مناڵ
مناڵبمەوە
بێهودە دەمەوێ
لەتۆدا بمرم
بەکەس نەڵێم ماڵئاوا
لەباخچەکەی تۆدا ڕاکشێم
کە خونچەیەك کرایەوە
هاوار کەم بێهوودەیە
سبەی دڵێك دەوەرێ

٢٠٠٥

## ڕێگایەك لە چاوەکانتەوە

دوور لە ڕێگای باران
دوور لە ڕێگای ـ باــ
بەڕێگکایەکی تر
دەگەمە باخچە
ڕێگایەك لەگەرمی چاوەکانتەوە

بۆ ژیان دەست پێدەکا
ڕێگایەك لە ڕوانینەکانتەوە
بۆ ئاسمان دەست پێدەکات
ڕێگایەك لەگریان و
پیکەنینەکانتەوە دەست پێدەکا
ڕێگایەك ئەو سەری بە عەشق
بە ئاسمان بەتەنیایی
بەمناڵی بەگریان بەنائومێدی
کۆتایی دێت
ڕێگایەك دێت
ڕێگایەك دەمباتەوە
بۆ دارستانەکان و شەونمی
خەوتووی سەر درەختەکان دەبینم
هێلانەی پڕ جریوەی
باڵندەکان دەبینم
کەچەند دوورن لە خەیاڵی
مردن و شەڕ
تۆ دەڵێی:
سەیرکە ئەم هێلانەی ژیانە
چەند پڕە لەباڵی نائومێدی
من دەڵێم ئەم ژیانە
چەن هێلانەی نائومێدی و
چەن ماڵی پڕ بەختەوەری درۆ
ئاوەدانی کردوتەوە

٢٠٠٥

## پیری ئاوڕ لەمناڵی دەداتەوەو دەگری

نامەوێت پیربم
نامەوێت بەکۆڵانەکانی پیریدا
تێپەڕم
نامەوێت سلاو لەپیری بکەم
نامەوێت دەنگی هیچ باڵندەیەکی پیر
بڕژێتە ژوورەکەمەوە

ناموێت هیچ ئاوێكی پیر
ئاگری خەیاڵەكانی منالیم بكوژێنێتەوە
ناموێت هیچ باخچەیەك
گوڵێكی پیرم بۆ بنێرێ
ناموێت هیچ ئەستێرەیەكی پیر
لە ئاسمانی منا هەڵبێ
ناموێت بەفری پیری
گوڵەكانی دڵم سپی كا
ناموێت شەوە گێژەكانی پیری رۆژەكانی تەمەنم
هەراسانبكەن
ناموێت ـ با ـ ی پیری
یاری بەچیمەنی باخچەكەم بكا
ناموێت لە هیچ ئاوێنەیەكی پیردا
رووخساری خۆم ببینم
ناموێت هیچ نورێكی پیر
خۆی بەناوچەوانمەوە هەڵواسێ
ئەمەوێت
منالبم منال
ئەمەوێت كال بم كال
ئەمەوێت لە دڵۆپێ بارانا
خەیالبم خەیال جولانە دروستكەم
ئەمەوێت لەسەر بالی باڵندەكان
دانیشم هەست بەگەورەیی
ئاسمان نەكەم
ئەمەوێت
لەگەل باڵندەكاندا بفرم
بۆ سەردەمێكی تر
كە نوقمی خۆكوشتنی
پەپوولە نەبێت
كە نوقمی دەربەدەر كردنی
كۆترەكان نەبێت
نوقمی شاردنەوەی جوانی و
ئەتك كردنی ژن نەبێت
ئەی دۆستی خەیاڵەكانی منالی

ئەی یاری شەوەکانی منالّی
من دلّم پڕە لە لەگولّ
من دلّم پڕە لە ئاو
من دلّم پڕە لە تیشك
نامەوێت هەست بەگەرمی
باخچە نەکەم
نامەوێت هەست بەتەنکی ـ با ـ و
نەرمو شلی ئاو بکەم
نامەوێت
هەستی بەمەستی بەفرو
بێدەنگی بەرد نەکەم
هاواردەکەم
ئەو ژنە باخچەیەك بوو لە گولّ
ئاسمانێك بوو لەکۆتر
لەئەستێرە مالّێك بوو لە گۆرانی و ئاواز
پێدەشتێك بوو لە شەپۆل
لەئاگر
دەریایەك بوو لە جوانی لە ناز
پیری خامۆشی کرد پیری
پیری روانینەکانی لێسەندەوە
پیری هەنگاوەکانی خاوکردەوە
پیری خەیالّەکانی کالّکردەوە
پیری سازی منالّی شکان
پیری چاوەکانی پڕکرد
لەتاریکی و گریان
لەئاسمانەکانی پیریدا
ژوورێك نیە بۆ ئاسودەیی
لە گەڕەکەکانی پیریدا
کۆلانێك نییە بۆ خەیالّ
لەدەریاکانی پیریدا
شەپۆلێك نییە بۆ پێکەنین
لە ئاهەنگەکانی پیریدا
گۆرانیەك نیە بێ خەم
ئەی منالّی من کاتێك

سەرگەردانم
ڕەنگەکانی تۆ لە ڕوخسارم کاڵبێتەوە
شوێن پێیەکانی تۆ
لەباخچەکەم دوور کەوێتەوە
ئەی منالّی من بەناوی عاشقەکانەوە قسە دەکەم
بەناوی مردووەکانەوە قسە دەکەم
ئەوانیش لە داخی پیری مردن
ئەی منالّی پیری پەنجەرەیەکە
بە ڕووی مردندا دەکرێتەوە
ئەی منالّی پیری دەرگایەکە
مردن ئەیکوتێ
پیری باڵندەیەکە
ڕوووەو مردن باڵەکانی کردۆتەوە
پیری ئاوێکە ڕوووەو مردن شەپۆلدەدا
پیری / با یەکە شتە سادەکان ئاڵۆزدەکات
دوا قسەی پیری ئەوەیە دەڵێ : هاوڕێ درەنگە
ئاوڕ لە منالّی مەدەرەوە ئەبێ بڕۆین
دڕەنگە وا خۆر ئاوا دەبێت . مردن لە سەری کۆڵانی لێگرتووین

2005

سووپاس بۆ ئاوێنە
ئاوێنە خۆم بۆ شی دەکاتەوە
ئاوێنە خۆم بە خۆم دەناسێنێ
ئاوێنە ڕامدەگرێت
ئاوێنە ئەیدوێنم ئەمدوێنێ
ئاوێنە شەرم لە گەڵدەکا
ئاوێنە پەشیمانییەکانم دەخوێنێتەوە
بە ئاوێنە نامەی تیشکی
بۆ کچەکەی دراوسێمان دەنێرم
بە شەوقی ئاوێنە
بە کچەکەی دراوسێمان دەڵێم
وەرە دڵداری بکەین

پێی دەڵێم : چرپەی دڵم
لە ناو شەوقی ئاوێنەدایەو
دەیگرمە تۆ
کە شتێکمان دیار نەبێ
سەیری ئاوینە دەکەین
کۆترەکان لە ئاوینەدا
بەرزتر دەفڕن
باخچەکان لە ئاوێنەدا
تەڕ تر دیارن
بووکەکان لە ئاوێنەدا
هەست بە بەختەوەری دەکەن
منداڵەکان لە ئاوێنەدا
ئەیانەوێت قسە بکەن
شۆفێرەکان لە ئاوێنەدا خەمی ئەوەیانە
سەلامەتی ژیان ببینن
زیندانەکان لە ئاوێنەدا
هەست بە ڕووناکی دەکەن
قەرەجەکان لە ئاوێنەدا
بۆ نیشتیمان دەگەڕێن
ئاوێنە هاوڕێی شتەکانە
تەنها مرۆڤەکان سەیری ئاوێنە ناکەن
سووپاس بۆ ئاوێنە
لە دڵی ئەودا زانیم
لە ژێر ئەم بارانەدا خەریکە ئاگر دەگرم
لەم ڕووناکییەدا پەیکەرێکم لە تاریکی
بەم بەفرە ڕەش ڕەش دەچمەوە
بەم بەیانییە
هەراسانی ڕژاوەتە چاوەکانی ئێوارەوە
سووپاس بۆ ئاوێنە
ڕووتبوونەوەکانی جوانتر کرد
پشکۆی لەزەتەکانی گەشاندەوە
دەستی گرتم بۆ کوچەکانی منداڵی
وێنەی ڕابردووی بۆ هێنامەوە
گریام ڕایگرتم پێی وتم :تۆ ئەمڕۆ لە دوێنێ ناچی

تۆ خۆت نیت ، ئەی خۆت لە کوێیە .

## دیسان منالّی

ئەی منالّی
کەمردم
تۆیش لەگەلّما
وەرە گۆڕەکەمەوە
کە سەفەرم کرد وەرە
لە تەنیشت دلّمەوە دانیشە
کە نووستم
سەرت بخە سەردلّم
کە گریام پێبکەنە
کە ئاگرم تێبەر بوو
سەتلّێ ئاو بێنە
ئەی منالّی ئەگەرچی
من دۆستی تۆم
بەلاّم دۆستی
گوناهیشم
ئەگەر چی دۆستی یاریم
بەلاّم دۆستی شەڕیشم
ئەگەرچی دۆستی بەختەوەریم
بەلاّم نائومێدیش بەشێکە لە من

## چی ئەتوانێ ڕەنگی وێنەکانی منالّی تۆخ کاتەوە

بەو بەفرە تاریکر
هەر درەختەکان
مەستی کۆلاّنن
هەر شەقامەکان
لەئاهی تەنیایی ئەزانن
کەس بەدەرەوەنیە
کەس دەرگا ناکاتەوە
کەس دەستی کلوە بەفرێ
ئاگرێ و بۆمالّ بیباتەوە

من جار جار بۆ ئەوەی
دڵی چاوم نەشکێنم
بە ئەستەم
پەنجەرەکە دەکەمەوە
هەوایەك سارد
یەك دوو کلوە بەفری هیلاك
خۆیان ئەکەن بەباڵندە
ئەڕژێتە چاوەکانمەوە
بۆنی گەڵا وەریوەکانی
باسی هیچ و پووچی
ژیان دەکەن
منیش بەهەناسەیەك سارد
وەك بای سەرگەردانی کۆڵان
مناڵی خۆم دێتەوە یاد
بەڵام دەنگێك لە دوورەوە
داڵێ: مەگەڕێ و نامدۆزیتەوە
هیچ بیرم لێمەکەرەوە
ئێستا چۆنی
ئاوابژی
وەك دووکەڵی جگەرەکەم
لەبۆشاییدا بڵاودەبمەوە
کەسێك لەمردن ناگەڕێتەوە
تازە خەیاڵی مناڵی
ئەم رۆژە ساردانە
گەرم ناکاتەوە
تازە ناسکیی مناڵی
نارژێتە چرچ و لۆچی
دەموچاومەوە
بەو بەفرە تاریکە
دڵم هەر لای مناڵیمە
ئەبێ ئەویش
بیرم نەکات
ئەبێ ئەویش
بۆمن نەگری

ئەبێ ئەویش
تەنیابێ
دڵم هەر لای ئەو کاتەیە
کە بەپەنجە وردەکانی
بێدەنگی پەنجەرەی ژوورەکەم
ڕاچەنێ
دڵم هەرلای ئەو ڕۆژەیە
کە لە چاخانەیەکدا
لە پاسێکدا
لەمزگەوتێکدا
لەپشتەوە چاوم بگرێ و
پیم پێکەنێ
من خەیاڵ ئەمنووسێتەوە
بەم هەموو گوناهەوە
بەم هەموو شکستەوە
بەم هەموو پەشیمانی و
حەسرەتەوە
چی ئەتوانێ
جارێکی تر
دەزووی پچڕاوی
کۆلارەیەکی منالی و
دڵی من گرێداتەوە
چی ئەتوانێ
هەڵماتێکی شووشەی ناسك
لەگەڵ دەستەکانی مندا
ئاشتکاتەوە
چی ئەتوانێ
ڕەنگی وێنەکانی منالی
تۆخ کاتەوە
چی ئەتوانێ
بەفروئاگر
تاریکی و خۆر
تەومژو سادەیی
شپرزەیی و ئارامی

جوانی و ناشرینی
کۆکاتەوە
بەو بەفرە تاریکە
من خەیاڵ ئەمنووسێتەوەو
دڵم هەر لای مناڵیمە

٢٠٠٥

## شەڕی خۆکوشتنی پیاوێك

وەرە شەڕی
خۆکوشتنی پیاوێك ببینە
شەڕی نیگەرانیەکانی
شەڕی حەسرەتەکانی
شەڕی پیاوێك ببینە
لەگەڵ ناخی خۆیدا
لەشاری ناوەوەی
ماڵێك نیە لەم شەڕەدا
وێران نەبێ
دارێ نیە لەم شەڕەدا
کەمێ هەناسەی پێ مابێ
باڵندەیەك نیە
باڵەکانی نەشکابێ
ئاوێنەیەك نیە
تاریکی نەینووسێتەوە
پەنجەرەیەك نیە
ترس پێوەی نەدابێ
دەرگایەك نیە
بۆکردنەوە بەتاسەوەنەبێ
باخچەیەك نیە
خەون بەسەوزاییەوە نەبینێ
شەقامێك نییە
تەنیایی پیاسەی لێنەکات

گۆڕەپانێ نییە
پڕنەبێ لەئاسەواری شەڕی
خۆکوشتنی ئەم پیاوە
ئەم پیاوە بەیانیان
لەگەڵ هەلاتنی خۆردا
ئاوادەبێ ئێواران لەگەڵ
ئاوابوونی خۆردا
هەڵدێ
ئەم پیاوە چەندین جار
خۆی کوشتووە
چەندین جار
لەسەر گۆڕەکەی خۆی
بخوردی داگیرساندوە
ئەم پیاوە
دەچێتە دەریاوە
بێدەنگی بەردەکان راودەکات
وەك باران
ئەڕژێتە تیشکە کاڵەکانی خۆرەوە
ئەم پیاوە
چیرۆکی ڕەنگاو ڕەنگی هەیە لە گەڵ ژندا

دەستێ گوڵ دەگرێ و
فڕێیدەداتە
ژێر پێی ژنەوە
بەئاگر دەڵێ
برۆ گەرمی لەژن وەرگرە
بەبەفر دەڵێ سلاو لە سپێتی
ژن بکە
بە کۆتر دەڵێ ژنێك لەتۆ زیاتر
دەفڕێ
بەباخچە دەڵێ
من مەستی بۆنی ژنم
نەك بۆنی تۆ
بەئەستێرە دەڵێ

من تیشکی چاوی ژنێك
لەت لەتی کردووم
نەك تیشکی تۆ
بەمانگ دەڵێ من وێرانی
تریفەی ژنێکم
نەك تریفەی تۆ
بە ـ باـ دەڵێ من شێواوی
هەناسەی ژنێکم
نەك وژەی هەناسەکانی تۆ
ئەم پیاوە
تا ئەوپەڕی مناڵی سادەیە
تا ئەوپەڕی باران تەڕە
تا ئەوپەڕی بەفر خەیاڵە
تا ئەوپەڕی بەرد بێدەنگە
تا ئەوپەڕی ئاسمان دەریایە
تا ئەوپەڕی دەریا ئاسمانە
تا ئەوپەڕی فڕین باڵە
تا ئەوپەڕی ژیان مناڵە
وەرە شەڕی خۆکوشتنی
پیاوێك ببینە
شەڕی نیگەرانیەکانی
شەڕی پەشیمانیەکانی
شەڕی حەسرەتەکانی
شەڕی شکستەکانی
وەرە شەڕی پیاوێك ببینە
بەرلەوەی خۆی بکوژێ
بەدەستە ئاڵەکانی تۆ کوژرا.

## پیاوێك پڕ لەخەیاڵی زمان

(*بۆ فەرهاد شاکەلی)

پیاوێك
نوقمی نیگەرانییە

کەزمانی ئەبینێ ڕژاوە
پیاوێك نوقمی دڵتەنگیە
کەزمانی ئەبینی کوژراوە
پیاوێك بەوە خوای نامێنێ
ئاسمانی زمانی
ئەستێرەی لێ ئەمرێ
ئەم پیاوە پرپڕە لەخەیاڵی زمان
ئەم پیاوە
پڕ پڕە لەباڵی زمان
ئەم پیاوە
پڕ پڕە لەخەیاڵی زمان
نابێ تۆ نیگەرانبی
ئەتوانی ڕۆحمان
بەنووری زمان داپۆشی
ئەتوانی وابکەی
دەریای زمانمان
لەتەمی ڕۆژگاردا
جوانتر بدرەوشێتەوە
ئامان نەهێڵی
گوڵی زمانمان بێ بۆن بێ
ئامان نەهێڵی
زمانمان وەك مناڵێکی
سەر گەردان بکری
ئامان نەهێڵی ببێتە هاوڕێی جەللادەکان
ئامان نەهێڵی
زمانمان سڵاو
لەبازرگانەکانی خاك بکا
ئامان نەهێڵی
خۆری زمانمان لەماڵی دڵدا
ئاوابێت
نەهێڵی زریان دەستی پایز بگرێ و
ڕەنگەکانی زمانمان بریندارکا
ئەتوانی ڕێ خۆشکەی بۆ باران
زمانمان تێر ئاوکا

زمانمان پاراوکا
ئامان نەهێڵێ
قەڵەمە بچوکەکان
باڵی کۆترەکانی زمانمان کەن
تۆ پیاوێکی پڕ پڕی لەخەیاڵی زمان
ئیشی تۆ ئەوەیە
بە بەفر بڵێی
بەکپی بەزمانەکەم بدوێ
بانەشێوێ
ئیشی تۆ ئەوەیە
لە ئاپۆرای شەقامێکدا
دەستی زمانەکەمان بگری
تا ماشێنی سیاسییەك
حیزبێك
نەیکاتە ژێرەوە
ئەی زمان دۆست
ئیشی تۆ ئەوەیە
کراسێك
لەشەونم و خۆر
بکەیتە بەری زمانەکەمان و
بەدەستە چڵکنەکان بڵێی
بۆخاتری خواوەند پیسی مەکەن

٢٠٠٥

## دڵم خۆشە خەریکە جوان دەبمەوە

پێدەکەنم
یان دەگریم
خەیاڵدەکەم یان مردووم
دڵم خۆشە
خەریکە جواندەبمەوە
دەڵێی ئەو رۆژەیە

کە تۆمبینی
دەڵێی ئەو رۆژەیە
بەناو باخچەکەدا
بارانەکە راویدەنام
وێنەکانی تۆم
بەدڵمەوە نووساندبوو
تاتەڕنەبن
دڵم خۆشە
دەڵێی ئەو رۆژەیە
بەزەردەخەنەوە
پەنجەرەکەت پێوەدا
دڵت بۆ کرمەوە
دەڵێی یەکەم رۆژە
گوڵ دەبینم
دەڵێی یەکەم جارە
گوێم لەهاژەی ئاو دەبێ
دەڵێی یەکەم ئێوارەیە
خۆم لەئاوێنەدا دەبینم
خەیاڵدەکەم یان مردووم
دڵم خۆشە
ژیان سادەیە
ئەمڕۆ لەو رۆژە ئەچێ
کە گۆرانییەك دەیبردمەوە
بۆ ئێوارانی کۆترەکان
گۆرانییەك
لەقرچەی نیوەڕۆی هاویندا
ناخی پڕ دەکردم لەبەفر
لەتۆفانی
شەوێکی زستاندا
وەك ئاگر ئەڕژایە
هەناسەی ژوورەکەمەوە
گۆرانییەك
گەڵاوگوڵە
وەریوەکانی لەئامێزدەگرت و

دەیووت : بەهارێك بەڕێگاوەیە
پڕە لەباڵندەو
رەنگ و ئاو
پڕە لەژیان و ناسکی و
خەیاڵ و هەتاو
گۆرانییەك
وەك دەست
پەنجەرەكانی دەكردەوە
وەك ــ باــ
درەختەكانی دەلەراندەوە
گۆرانیەك
دەمكاتە پیاوێك لەخەیاڵ
گۆرانییەك
وەك دەستێ
پەنجەرەكان دەكاتەوە
دڵم خۆشە
خەریكە جواندەبمەوە
دەڵێی ئەو رۆژەیە
تۆم بینی
دەڵێی ئەو رۆژەیە
دەرگای قەفەزەكانمان شكان
دەڵێی ئەو رۆژەیە
وێنەكانی دیكتاتۆرمان دڕاند
دەڵێی ئەو رۆژەیە
لەسەر بەفرەكە
نووسیمان
بەكپی یەكمان خۆشدەوێ
دەڵێی ئەو رۆژەیە
لێوت وەك لێوی گوڵەكان سووربوو
چاوت وەك ئەستێرەكان
ئەدرەوشایەوە
قژت وەك قەرسیلەكان
پڕبوو لە باڵندە
كوڵمەكانت وەك مانگ

تریفەی لێدەڕژا
مەمکەکانت
وەك دەریاکان
شەپۆلیان دەدا
خۆیشت وەك ژیان
تەڕ تەڕ بووی بەعەشق
بەڕوانین
بەسووتان
دڵم خۆشە
خەریکە جوان دەبمەوە
دەڵێی ئەو ڕۆژەیە
تۆم بینی
دەڵێی ئەو ڕۆژەیە
بەزەردەخەنەوە
پەنجەرەکەت پێوەداو
دڵت بۆ کردمەوە

## سبەی کەسێك وەك من

نامەکانم
فڕێدایە دەریاوە
دەمی ماسییەکانم
پڕ کرد لەخۆڵ
سەگەکانم
لەقەرسیلەکاندا بەستەوە
هێلانەی کۆترەکانم
بەدووکەڵ شاردەوە
دڵی ئاوێنەکانم
پارچە پارچە کرد
وێنەکانم دایە دەم باوە
کتێبەکانم
کردە کۆلارەیەك و
لەباڵەکانیم نووسی
مناڵی تۆ لەکوێی

بۆ ناگەڕێیتەوە
لەوە زیاتر
بەرگەی ئەم ژیانە
هیچە ناگرم
یادگارییەکانم
فرێدایە ئاخوڕی ئەسپەکانەوە

ئەوپەنجەرەیەی
بەیانیان بەڕوی دەریادا دەمکردەوە
بەتاریکیم سپارد
چۆلەکەکان بەجریووە
ژیانیان دەنووسییەوە
تاکێك پێڵاوم تێگرن
شتەکانم قسەدەکەن
ژیان فەرامۆشیکردووین
شەقامەکان پڕبوون
لەگەڵای وەریوو
خۆشترین بۆن
لەگیانی مردووی
ئەوانەوە ئەرژێتە باوە
من بۆئەستێرەیەکی
سەرگەردان دەگەرێم
ورشەی لە هیچ
ئاسمانیکەوە نابینرێ
من پەستم نیگەرانم
خەمبارم
پەستی ئەوەم
سبەی هی من نیەو
کەسێکی تر
لەشەقامەکاندا
بەشوێنپێکانی مندا
دەڕواو
هەست بەگەرمی
شوێن پێیەکانی من ناکات

کەسێکی تر وەك من
لە دەرگایەك دەداو
هەست بەچاوەڕوانی
من ناکات بۆ کردنەوەی دەرگا
بۆکردنەوەی یەکەم قسە
کەسێکی تر
وەك من
نوکتەیەك دەگێڕێتەوەو
نازانێ کەمن دەیان جار
ئەو نوکتەیەم
بۆ برادەرەکانم
گێڕاوەتەوە
کەسێکی تر وەك من
نامەیەك بۆ دڵدارەکەی دەنوسێ و
وەك من
بەخۆشەویستەکەی دەڵێ:
تۆ ئاسمانی
تۆ دەریای
تۆ بارانی
تۆ باخچەی گوڵەکانی
تۆ ناسکی
پاکی جوانی
من پەستم
نیگەرانم
خەمبارم
خەمباری ئەوەم
سبەی بەڵێ سبەی
لەگەڵ فڕینی باڵندەکاندا
لەگەڵ وەرینی گوڵەکاندا
کەسێك وەك من
چاوی پڕ دەبێ لەفرمێسك
دڵی پڕئەبێ لەخوریە
کەسێك وەك من
لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا

هەست بەهیچ و پووچی
ژیان دەکا
کەسێك وەك من
لەگەڵ گەورەبووندا
تادێ منداڵدەبێتەوە
کەسێك وەك من
هەمیشە قاچ ئەخاتە ئاوەکانەوە
هەست بەهاژەی بەرد ناکات
کەسێك وەك من
بەدرەختەکاندا
سەردەکەوێ و
شوێن دەستەکانم نابینێ
کەپڕن لەپەرۆشی بۆ ژیان
کەسێك وەك من
لەئاوێنەدا
خۆی دەدوێنێ و
گوێی لەچرپەی دەنگی من نابێ
گوێی لەمەراقەکانم نابێ
کە بۆ بەسەرچوونی تەمەن
دەیخۆم
وێنەکانی من نابینێ
بەدڵی ئاوێنەوە
کەسێك وەك من
بەژێربارانداا رادەکاو
من نیم نا من نیم
وەك من
گوێ لەکپی بەفر دەگرێ و
من نیم
وەك من
لەگەڵ کۆترەکاندا دەفڕێ و
من نیم
وەك من
دەستی لەگەڵ چیمەنی
باخچەدا تێکەڵ دەکاو

من نیم
من ئەوکاتە
تۆزی سەر پەنجەرەی
ماڵە چۆڵەکانم
گەڵای وەریووی
درەختەکانم
من ئەوکاتە
وێنەیەکی دڕاوی قەراغ جۆگایەکم
نامەیەکی فەرامۆشکراوم
دێر دێڕ
کاڵدەبمەوە
ئەستێرەیەکی شکاوم
تاریکی دامئەپۆشێ
کتێبێکم
لەسەر رەفەکانی مردن
هیچ دەستێکی ژیان
لاپەڕەکانم هەڵناداتەوە
کۆترێکم لەبەرد
زمانی فڕین نازانم
ئاگرێکم
دەستی پەپوولەیەکم
بۆ گەرم ناکرێتەوە
دەریایەکم
تینوێتی
گوڵێکم پێناشکێ
من پەستم
نیگەرانم
خەمبارم
خەمباری ئەوەم
سبەی هی من نیە
سبەی کەسێك وەك من
لەکەناری دەریادا
لەنەورەسەکان
دەڕوانێ و

ئایەتی تەڕ بوون
دەخوێنێ و
هەست بەچرپەی
دەنگی من ناکات
کە ئەڕژێتە شەپۆلەکانەوە
سبەی کەسێك وەك من
بۆ تەنیایی ژنیك
ئەسووتێ و
هەست بەسۆزی من ناکات
سبەی کەسێك وەك من
بیرلە خواوەند دەکاتەوەو
من نیم
بیر لەمردن و ژیان
دەکاتەوەو
من نیم
بیرلە منالّی و
عەشق دەکاتەوەو
من نیم
سبەی کەسێك
وەك من
بەمەرگی مرۆڤێك
ئەسپێك کۆترێك
هەراسانی دەبێ و
من نیم
سبەی کەسێك
وەك من
دووبارە دەبێتەوەو
من نیم
وەك من خەیالّ دەکاو
وەك من دەژی و
وەك من دەمرێ
من نیم. چونکە ئەوکاتە
من لەدەرەوەی بوونم
من نابم ــ من نیم

## خەلیل، بوو بەحەسرەتی دڵ

هاوڕێ
تۆیش ڕۆیشتی
تۆیش
بووی بەهەواڵێکی ناکاو
بووی بەخەمێکی ڕژاو...
بووی بەحەسرەتی دڵ
بەیادگاری و
بیرەوەری
بەئەشکی چاو
ئای مەرگ چەن غەداری
ئیدی خەلیل نابینم
لەهیچ شەقامێکی دونیادا
پیاسەیەك بکات
ئیدی خەلیل نابینم
لە هیچ باخچەیەکی دونیادا
گوڵێك لێبکاتەوە
ئیدی خەلیل نابینم
لەسەر هیچ شانۆیەك
جولەیەك بکات
شتێك بڵێ
ئیدی خەلیل نابینم
سەرقاڵی
نووسینەوەی
هەواڵێك بێت
بێئاگا لە مەرگی خۆی
ئیدی خەلیل نابینم
بەبینینی کتێبێکی تازە
گەشبێتەوە
ئیدی خەلیل نابینم

لەڕەنگی کاڵی تابلۆیەك
وردبێتەوە
ئای مەرگی چەن غەداری
ئیدی خەلیل نابینم
خەلیل و باوکی
خەلیل و مناڵەکانی
خەلیل و هاوڕێکانی
خەلیل و شارەکەی
خەلیل و کتێبەکانی
خەلیل و چاوی کامێراکەی
یەکتر نابیننەوە
ئای مەرگ چەن غەداری
خەلیل شەقامێك بوو
لە هێمنی
تۆ پێچاتەوە
خەلیل باخچەیەك بوو لەبرادەری
تۆ هەڵتوەراند
خەلیل ئەکتەرێك بوو
لە خۆشەویستی
نەتهێشت
دەورەکانی تەواوکات
خەلیل کتێبێك بوو لەگوڵ
تۆ سڕیتەوە
خەلیل تابلۆیەك بوو
لەڕەنگی خەماویی
تۆ شکانت
ئای مەرگ
چەن غەداری
خەلیل ڕۆیی
خەلیل بوو بەهەواڵێکی ناکاو
خەلیل بوو بەخەمیکی ڕژاو
خەلیل بوو بەحەسرەتی دڵ
بەیادگاری و بیرەوەری و
بەئەشکی چاو

ئای هاورێ خەمبارەکەم
هێشتا زوو بوو
تۆ رێبواری
ژیانێکی پڕ لە جوانی
تۆ باڵندەی نیشتمانی کۆڵنەدانی
تۆ ئەستێرەی
ئاسمانێك بووی
هەڵدێیتەوە
تۆ کڵپەی باوە گوڕ گوڕی
ناکوژێیتەوە
لەگۆڕیشدا
چاوانت پڕ ئەستێرەیە
جەستەت لەوێ و
مەلی گیانت هەر لێرەیە
هەموو دەمێ یادت دەکەین
لەیادمانی
تەمەن کورت و
خەرمانێك پڕ تێکۆشانی..
پڕ خەون بوو ،
پڕ لە هیوا زەمەنی تۆ..
مەرگ نەیهێشت بەختەوەربێ تەمەنی تۆ
مەرگ نەیهێشت
بگاتە گشت شوێنێ ناوت
مەرگ نەیهێشت
تەواو هەڵبێ خۆری چاوت
هێشتا زوو بوو بۆ کۆچی لە ناکاوی تۆ
هێشتا زوو بوو
بۆ لێکنانی
دوو چاوی تۆ
ئەی مانگەشەو ئەی کازیوەی دەم بەیانی
سارێژی کەن
یەکە یەکە زامەکانی
٢٠٠٥/٥/٩

ئەم شێعرە بۆ مەرگی هاوڕێم خەلیل عەبدوڵڵا نووسراوە کە لەڕێکەوتی

٢٠٠٥/٥/٩ بەکارەساتاتی سەیارە بۆ یەکجاری چاوەکانی لێکناو بووبەحەسرەتی دڵ

## دیکتاتۆر

دیکتاتۆر
لە خوێندا
ئەستێرە دەبینێ
لای دیکتاتۆر
خوێن لەشەونمی
سەر باڵی باڵندەکان
جوانترو
ناسکترە
دیکتاتۆر
عاشقی تەرمە
تەرمی ئینسان و
دار و بەرد
هیچ باخچەیەك
هیچ دەریایەك
هیچ دارستانیك
هێندەی تەرمێك
سەرنجی دیکتاتۆر
راناکێشێ
هیچ ئاهەنگێك
هێندە تەرمی کۆترێ
دیکتاتۆر سەرمەستناکا
هیچ شارێك
هێندەی ئاسەواری
شەڕەکان زەردەخەنە
ناخاتە سەر لێوی
دیکتاتۆر
هیچ رەنگێك

وەك رەنگی ئەشكەنجە
لای دیكتاتۆر
رەنگین نیە
هیچ دەنگێك
وەك نالە نالّ و گریان
لای دیكتاتۆر خۆش نیە
هیچ دەستێك
وەك دەستی ترس
لای دیكتاتۆر
پیرۆزنیە
هیچ پەیامێك
وەك پەیامی كوشتن
لای دیكتاتۆر
بەسۆزنیە
خەیاڵەكانی دیكتاتۆر
مەلەكردنە لەخوێندا
خەیاڵەكانی دیكتاتۆر
شاردنەوەی ژیانە
بەتەرم
خەیاڵەكانی دیكتاتۆر
پرن لەشەڕو
كوشتن و
ترس
خەیاڵەكانی دیكتاتۆر
پرن لە گومان و
دابڕان و
زیندان
خەیاڵەكانی دیكتاتۆر
خاڵین لە گول و باڵندە و ئارامی
خەیاڵەكانی دیكتاتۆر
خاڵین لەسۆزو جوانی
روانینەكانی دیكتاتۆر
پڕن لە شەڕ
بیركردنەوەی دیكتاتۆر

پڕە لەمەرگ
هەنگاوەکانی دیکتاتۆر
پڕن لەتەرم
هەمووشتەکانی دیکتاتۆر
پەیوەستن
بەشەڕ
بەتەرم
بەخوێن
بەمەرگ
هەموو ڕێگاکانی
دیکتاتۆر
دەچنەوەسەر
وێرانکردن
پیکانینەکانی دیکتاتۆر
بەشی هیچ ناکەن
ئارامییەکانی دیکتاتۆر
بەشی هیچ ناکەن
دیکتاتۆر
لەنێوان فرین و زینداندا
زیندان هەڵدەبژێرێ
لەنێوان منداڵ و ژەهردا
ژەهر هەڵدەبژێرێ
لەنێوان پەپوولەو مەرگدا
مەرگ هەڵدەبژێرێ
لەنێوان تاریکی و تریفەدا
تاریکی هەڵدەبژێرێ
لەنێوان گریان و
گۆرانیدا
گریان هەڵدەبژێرێ
لەنێوان دۆزەخ و
باخچەدا
دۆزەخ هەڵدەبژێرێ
لەنێوان خواوەندو
شەیتاندا

شەیتان هەڵدەبژێرێ
دیکتاتۆر
کۆڵانەکانی پڕکرد
لەمناڵی کەمئەندام
شارەکانی پڕکرد
لە ئۆردوگای نەخۆش
ئۆردوگاکانی پڕکرد
لەبێوەژنی رەشپۆش
ئەو مرۆڤانەی
لەچاوەڕوانی
هاتنەوەی ئازیزەکانیاندا
بەداخ و حەسرەتەوە
دەمرن
دیکتاتۆر
کوردی وەك مەسیح
لەخاچ دا
گوندەکانی کوردی داغانکرد
دەمی مناڵی پڕکرد لەگڕ
چاوی کانی عاشقانی
بەقوڕی تاریکی سواخ دا
دڵی رەزو دارستانی
بەدوکەڵی ژەهر خنکان
ئەستێرەی
خەونی کوردی کوشت
کازیوەی کوردی سەربڕی
ئاوێنەی ژیانی شکان
ئێستا خەمەکانی ئۆردوگا
بەحەسرەت و
مەراقەوە
دەڵێن دیکتاتۆری بێشەرەف
کوێ بگەڕێین
بەشوێن مناڵەکانماندا
کوێ بگەڕێین
بەدووی ئازیزەکانماندا

هیچت نەهێشت
لەو هەموو
شایی و گۆرانی و
پێکەنینە
تەنیایی ئەمانخواتەوە
ئای دیکتاتۆری
هیچ و پوچ
کۆلانەکانی ئۆردوگا
بۆنی هەناسەی
گوندەکان نادەن
ئاپۆرای شارەکان
وەك کپی گوندەکان
شادی نابەخشن
ئای دیکتاتۆری بێئینسان
چاومان هەر لەرێی
گەرانەوەی
گوڵەکانی بیابانە
سۆمای چاوەکانمان دەرواو
ئەنفالەکان
ناگەرێنەوە
رۆژەکانی تەمەنمان
هەڵدەوەرێ و
پشکۆی یادەکانیان
دەگەشێتەوە
ئەنفالەکان ناگەرێنەوە
دیکتاتۆر
هیچی نەهێشت بۆ ژیان
هیچ
هیچی نەهیشت بۆخەیاڵ
هیچ
هیچی نەهێشت بۆفرین
هیچ
هیچی نەهێشت بۆ ئەوین
هیچ

هیچی نەهێشت بۆ روانین
هیچ
دارو بەردو ئاوی کوشت
خاك و هەواو ئاسمانی کوشت
لەسەر رۆحی سپی ئێمە
تاریکی خۆی دەنووسێتەوە
دیکتاتۆر شەوی خۆی
لەرۆژی ئێمەدا
تاقیکردەوە
دیکتاتۆر هەزار
کتێبی
پر لە درۆ
پڕ لە شەرم
پڕ لە خوێن
پڕ لە تاریکی
بۆستایشی تۆ نووسران
دیکتاتۆر
هاواری دەکرد
مردن ناگاتە من
دیکتاتۆر
لەخەیاڵەکانیا تۆپی
تەرم کوشتی
شەڕ کوشتی
ترس کوشتی
خوێن کوشتی
بەڵام شەوی ئێمە
خاڵییە لە ئەستێرە
بەیانیانی ئیمە
خاڵییە لەگوڵ و باڵندە
هەربایەك هەڵدەکا
پڕە لەهەناسەی دیکتاتۆر
هەر گنییەك
دەبیستین
چرپەی تاریکی دیکتاتۆری تێدایە

بەتەنیشت
هەرباخچەیەکدا تێدەپەڕین
پڕە لە بۆنی دیکتاتۆر
لەهەر ئاسمانێك دەڕوانین
ئەستێرەی دیکتاتۆر
ئەدرەوشێتەوە
هەر بارانێك
دەبارێ پڕە لەرێژنەی دیکتاتۆر
لەهەر نوێژێکدا
پاڕانەوەیەك
بۆ دیکتاتۆر
ئێمەپەروەردەی ترسەکانی
دیکتاتۆرین
ئیمە دووژمنی دیکتاتۆرین
کەچی لەهەریەکێکماندا
هەناسەیەکی دیکتاتۆر هەیە
لەخەیاڵی هەریەکێکماندا
دیکتاتۆرێ بەرێوەیە

## ئەی ژن دەستەکانت لە ،با غەمباترن

ئەی ژن ئەی باڵندەی ئاو
ئەی گوڵی روناکی
ئەی کپی بەفر
ئەی دەنگی باران
ئەی سەوزایی باغ
وەرە بچینە کەنار دەریای ئاگر
بۆنی گیای خەیاڵ بکەین
وەرە ئەی ژن
فرمێسکەکانم
لەئاگر گەرمترن
روانینەکانم
لەتیشك تیژترن
دەستەکانت لە ـ باـ غەمبارترن

وەرە ئەی ژن
ڕۆژەکانم
پڕ لەقەدەری شکاو
وەرە ئەی ژن
ئەی باڵندەی ئاو
بچینە کەنار دەریای ئاگر
بۆنی گیای خەیاڵ بکەین
وەرە ئەمەوێ خەون ببینم
ئەمەوێ
پڕم کەی لەجریوەی چۆلەکە
لەکاتی بەیانیدا
پڕمکەی لە ساکاری منداڵ
لەکاتی گریاندا
وەرە ئەی ژن
من بێ تۆ
پڕم لەباغ و
هەست بەگەڵای دارێك ناکەم
پرم لەئاسمان و
شوێن پێی فڕینێك نابینم
وەرە ئەی ژن
بێ تۆ
پرم لەخەیاڵ و
بەتاڵم لەژیان
پڕم لەخواوەندو
بەتاڵم لەئیمان

٢٠٠٥

## ووردەکارییەکانی مەرگی من

دێتەوە یادم
ئەستێرەیەکی سەرگەردان بووم
هیچ ئاسمانێك
دەستێکی بۆ درێژ نەکردم
تەنها دەستێك
دنیایەك تیشك بووم

لەلوتکەکانی نائارامیدا
شکستەکانم دەگەڕانەوە
هێزم لە بەردو
دارو
ئاووئاگرو
خاك وخەڵك
وەردەگرت
عەشق بوون
دەڕژانە رۆحمەوە
شینایی ئاسمان بوون
بۆ کۆترکانی خەیاڵم
بۆ سەوزبوونی
روانینەکانم
شینایی ئاسمان بوون
بۆ دوارِۆژی فڕین
بۆ گەش بوونەوەی
گوڵەکانی خوێن
بۆ هەستانەوەی
شوپۆلەکانی ئەوین
رەنگێك بوو
وەك رەنگی ئازادی گوڵ
دەڕژایە درزەکانی خاکەوە
باڵەخانەی دنیایەکی جوانم
لەتەم و کازیوەدا دەبینی
دێتەوە یادم
وردەکارییەکانی
مەرگی من
چەندین دەست و دڵ
دەیانچنی
لەباخچەکانی دونیادا
باڵندەیەك
گوڵێك
لەرەنگی ئازارەکانم نەبوو
ئاوێنەیەك

بۆ پیشاندانی
قوربانییەکانی من نەدەبینرا
تابلۆیەك
بۆ گوڵەکانی بیابان
هەڵنەواسرابوو
لەدەریاکانی دونیادا
کەشتیەك نەبوو
بۆ هەڵگرتنی مەینەتیەکانم
دێتەوەیادم
سەراب و ئاو
لەسەر کوشتنی من
چەندین نامەیان
بۆیەکتر ناردبوو
تاریکی و خۆر
لەیەکەم دانیشتندا
لەسەر کوشتنی من
رێکەوتبوون
دێتەوە یادم
هەموو دونیا بەشداربوون
لەوردەکارییەکانی
مەرگی مندا
دێتەوە یادم
لەژێردارو پەردووی
رووخاوی گوندەکاندا
هێلانەی کۆترەکان و
خرِبوونەوەی
ئێوارانی خەڵك و
تریفەی پێکەنینی
کچانم دەبینی
خورەو هاژەی
ئاوی چەمەکانم دەبینی
کانیاوی وەك مناڵ و
جۆگەی ناو قەد
باریکم دەبینی

لەژێر دارو پەردووی
روخاوی گوندەکاندا
ژووانی دڵداری و
یادگاریم دەبینی
بێدەنگی دونیاو
هاواری کوردو
گەرم و گوڕی ژیانم دەبینی
کەرامەتی بریینداری
نیشتیمانم دەبینی

## گۆرانیەك
## بۆ رۆیشتی

بۆ رۆیشتی بۆ ڕۆیستی بۆچی بۆ
هیچت نەووت بەجێت هێشتم بەبێ هۆ
تۆ رۆیشتی و نەتپرسی لەحاڵی من
بێ تۆ چۆڵەو خامۆش بووە ماڵی من
* * *

بیرم ناچی کەچرپەی دەنگم بیستی
بەڕوانینێك شەیدات بووم خۆشم ویستی
یەکەم نیگات وەك باران تەڕی کردم
ئای لەرۆحم چەن سەختە بۆ نەمردم
* * *

بۆ نەمردم وابەتەنیا مامەوە
چاو بەئەشك ودڵ بەداخ وزامەوە
هەریادی تۆ ئاسۆی تێڕوانینمە
ئەوێنی تۆ دوواهەمین ئەوینمە
* * *

دارو بەردی ماڵەکەم بێ رەنگ و بۆن
ئەوانیش هەر وەك من عاشقی تۆن
لیم ئەپرسن رۆژێ دادێ بێتەوە
من هیچ ناڵێم تۆش وەڵام نادیتەوە
* * *

ئەم هۆنراوەیە : کاك میکائیل ئاوازی بۆداناوە و چڕیوێتی

تیرۆر
تیرۆر
دووژمنی ژیان و شەقام و گۆرانی و
منالە
دووژمنی ئەوین و پێکەنین و
خەیالە
دووژمنی باخچەو کۆتروژنە
دووژمنی خواوەندە
هەردۆستی مردنە
٢٠٠٥

وەك هەولێکی سەرەتایی ئەم چوارشیعرەم
لـــــەدیوانی Naturochkultur ـلەســــــویدیەوە کردە
کوردی ـ هیوادارم لەداهاتوودا بتوانم هەمووشیعرەکانی ساعیر
Carlolofnyman بکەمە کوردی ـ ناتور ئۆك کلتور ناوی
دیوانەکەیە ــ سروشت و کلتور ـــــــ

١

ئاو
من گەرمم
هەر وەك رۆژێکی گەرم هەیە
ئاوفێنکە ساردنیە
ئاو ووردە ووردە سەرکەوت
فێنکایی بۆ من هات
ئەو کاتانەی من لەسەرخۆ
رۆیشتم بۆ قولایی ئاو
سکم کەمێ سەرمای بوو
وەستام بۆکاتێکی کەم
راکشام لەئاو دا

وەرزشم کرد لەئاو دا
هەموو من خلیسکا بۆ ناو دەریاچەکە
ئاو دژی من دێ
ئاو بازنەیەکی بەدەوری منداکێشا
من لەئاودا
تەڕم
هێمنم
وەبەختیارم

## تاسەکردن

من تاسەی
هاوینان دەکەم
من تاسەی
باوکم دەکەم
من تاسەی
برادەرەکەم دەکەم
من تاسەی
ئەوەدەکەم چاك ببمەوە
من تاسەی گەڕانەوە دەکەم
بۆ وولاتەکەم
من تاسەدەکەم
ئێمەزۆرین تاسەدەکەین
ئەشێ هەموومان
تاسەی شتێ بکەین
زۆرجیاوازە
ئەبێ ئێمە سەرەڕای ئەمانەیش
تاسەی یەك شت بکەین
٢٠٠٤



غەم
کەسێك کەمن زۆر حەزم لێبێت

نەماوەتەوە لەلام
کەسێك کەمن زۆرم حەزلێبێت
لەمن دوور کەوتەوە
جار جار من ئەتوانم ئەوە لەبیرکەم
بۆ کاتێکی کەم
کە من دوای ئەوەم بەبیردێتەوە
من دەڵێم
ئەوە راست نیە
نا ــ نا ــ ئەوە راست نیە
دوای من زانیم
ئەوە راستە
پێویستە کەسێك بۆ من بێتەوەو
بڵێ ئەوە راست نیە
ئەگینا چۆن ئەتوانم
جارێکی تر پێکەنم
٢٠٠٥

٤

ببورە
من پێویستە
بڵێم ببورە
من ئەزانم کەمن پێویستە
من پێویستە تەواوی کەم
بەڵام چۆم من ئەمەی بڵێم
چۆن ئەتوانم من تەواوی کەم
چی وشەیەك هەڵبژێرم
دەبێ هەموو ئاواگێلبین
من دەتوانم
هەندێ جار گێلبیم
من دەبێ وشەیەك بدۆزمەوە
تۆ ئاواتێدەگەی
ببورە
هەموو رۆژێ من بیردەکەمەوە

كە چۆن بەتۆ بڵێم
تاتێبگەی
تۆ درەنگ هاتی
منت بینی لەگەڵ تورەیی چاومدا
ئاوامنت دۆزییەوە
بەبێ وشە
من ناتوانم
هیچ بڵێم
ئەو وشە بچوکە نەبێ
ببورە
چاوی تۆ بۆ من بێدەنگە
٢٠٠٥

## قسەیەکی نا تەواو

وەرە دانیشین
قسەیەك بكەین
کێ دەڵێ جارێکی تر
دادەنیشین و
شتێك دەڵێین
کێ دەڵێ جارێکی تر پێکەوە
وێنەیەك دەگرین
پێکەوە نانێك دەخوین
پێکەوە بەشەقامێکدا
پیاسەدەکەین
پێکەوە پێدەکەنین
کێ دەڵێ جارێکی تر
پێکەوە سەیری ئاسمان دەکەین
کێ دەڵێ جارێکی تر
پێکەوە پێکێك دەخۆینەوە
کێ دەڵێ جارێکی تر
پێکەوە لەخۆرئاوابوون دەڕوانین
پێکەوە دەرۆینەوە

کێ دەڵێ پێم بڵێ کێ

٢٠٠٥

. سوپاس
سوپاسی برای شاعیروخۆشەویستم
کاك محەمەد کوردۆ دەکەم کە بەچاپکردنی ئەم دیوانەوە
ماندوو بوو هیوادارم هەرشادو تەمەن درێژبێت

لەچاپکراوەکانی شاعیر

١. پێناسەی جەستەیەکی رزیو
٢.رۆمانی ماچ
٣.گوناهەکانی بەفروسێبەر
٤. پیاوێکی شکاو